**کتێب : گوڵستانی ئەولیا**

**بەرگ : یەکەم**

**ساڵی بڵاوکردنەوە : ٢٠٢١**

**کۆکردنەوە و ئامادەکردن : هەژێر ئیسماعیل لالە ئەحمەد**



## بەناوی خودای گەورە و میهرەبان

سوپاس بۆ ئەو خودایەی ئەم ئومەتەی رێزدار کرد و لەناو ئەم ئومەتەشدا کەسانێکی کرد بە دۆستی خۆی و گەیشتن بە قافڵەی رێگای سەرفرازان ، درووود و سەڵەوات لەسەر ڕەهبەری پێغەمبەران حەزرەتی موحەممەد (صـــلی الله علیه وســـلم) و ئالوبەیتی پاک و یاوەرانی چاکی هەتا ڕۆژی دوایی ، ئەم کتێبەی لە بەردەســـتی تۆی خوێنەری بەڕێزە ، بریتیە لە کتێبێک کە باس لە ژیاننامەی پیاوچاکان دەکات ، لە نوسینی ئەم کتێبەدا سوود لە چەندین سەرچاوەی مێژوویی وەرگیراوە کە لە پەراوێزەکان ئاماژە بە سەرچاوەکانیان دراوە ، بەو هیوایەم ئەم کتێب و بەرهەمە سوودبەخش بێت بۆ خزمەتکردنی مێژوو و کتێبخانەی کوردی

"هەژیر"

## "حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی" [1]

**حەزرەتی شێخ مەولانا خالیدی بەغدادی ذي الجناحين مەشهور بە مەولانا خالیدی شارەزوری نەقشبەندی ، ناوی تەواوەتی خالید کوڕی ئەحمەد کوڕی حوسـێنە لە عەشـیرەتی جافی میکائیلی یە ، لە بنەماڵی پیر میکائیلە ، لە نەتەوەی حەزرەتی عوسـمانی کوڕی عەفانە (خودا لێی ڕازی بێت) ، دایکی مەولانا سـەیدزادە فاتیمە خاتوونە لە بنەماڵەی سەید موحەممەدی زاهید ناسراو بە (پیر خدری شاهۆ) ، مەولانا خالید نازناوی (ضیاء الدين)ە ، ساڵی ١١٩٣ای کۆچی - ١٧٧٩ زاینی لە ناحیەی (قەرەداغ) هاتووەتە دونیاوە**

**لە قەرەداغ دەستی کردووە بە خوێندن ، لەلای چەندین زانا خوێندوویەتی لەوانەش:**

1. **سەید عبدالکریم بەرزنجی**
2. **شێخ عبدالله ی خەرپانی**
3. **سەید عبدالرحیم بەرزنجی**
4. **مەلا صاڵحی تەرەماری**
5. **مەلا ئیبراهیمی بیارەیی**
6. **مەلا جەلالی خورماڵی**

---

1 سەرچاوەکان :

١. مەلا طاهر مەلا عبدالله بەحرکەیی ، مێژووی زانایانی کورد ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە (٣٤١ – ٣٤٦)

٢. محمد امین زکی ، تأريخ السليمانية ، لاپەڕە (١٧٧ – ١٨١)

٣. بابەشێخ مەردۆخ ڕۆحانی ، مێژووی ناودارانی کورد ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە (٣٠٢ – ٣١٧)

٤. محمد مطيع الحافظ و نزار أباظه ، علماء دمشق وأعيانها في قرن الثالث عشر الهجري ، بەشی یەکەم ، لاپەڕە (٢٩٨ – ٣٣٥)

٥. عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد ، نەقشبەند و نەقشبەندییەکان ، لاپەڕە (٩٨ – ١١٨)

7. **مەلا صبغة الله ی زیارەتی**

8. **مەلا موحەمەد ئیبن ئادەم بالەکی**

9. **شێخ قەسیمی سنەیی مەردۆخی**

10. **مەلا عبدالله ی گەورە**

**پاشـــان دێتە شـــاری ســـلێمانی لە مزگەوتی عەزیز ئاغا دەســـت دەکات بە دەرســـدانەوەی فەقێکان پاشـــان دەچێتە مزگەوتی عبدالرحمن پاشا کە ناسراوە بە مزگەوتی بابا عەلی ، ماوەیەکی زۆر لەوێ دەرس دەدات ، پاشان ساڵی ١٨٠٥ی زاینی لە ڕێگای شام دەچێت بۆ حەج**

**مەولانا دەفەرموێ لەوێ بەدوای پیاوچاکان دەگەڕام تا گوێ لە ئامۆژگاریەکانیان بگرم ، گەیشـــتم بەخزمەت شـــێخێکی یەمەنی زانا و دانا ، ئەویش چەند ئامۆژگاریەکی کردم ، یەکێک لەوانە فەرمووی : لە مەککەدا ئینکاری مەکە لە شـــتێک کە بینیت ڕوکەشـــەکەی پێچەوانەی شـــەرعە ، مەولانا دەفەرموێ کە گەیشـــتمە مەککە ، ڕۆژی هەینی چومە حەرەمی مەککی ، لەلای کەعبەی شــــەریفە دانیشـــــتم و کتێبی دەلائیل م دەخوێند ، بینیم پیاوێکی ڕیش ڕەش کە جلێکی ســـادەی لەبەر بوو و پشـــتی دابوو بەســـەر قەراغەکانی کەعبەدا و ڕووی کردبووە من ، منیش لە نـاو دڵی خۆمـدا وتم ئەم پیـاوە ئەدەبی نیە لەگەڵ کەعبەدا ، ئەویش پێی وتم : ئەی تۆ نازانی ڕێزی مرۆڤ و حورمەتی لای خودا گەورەترە لە حورمەتی کەعبە ، ئیتر بۆچی ڕێگری لە پشـتکردنم لە کەعبە و ڕوکردنم لە تۆ دەکەیت ، ئایا گوێت لە ئامۆژگاری خەڵکی مەدینە نەبوو ؟ ، منیش گومانم لا نەما کە یەکێکە لە ئەولیا گەورەکان و بەم ڕەفتارانە خۆی شـاردۆتەوە ، دەسـتیم**

**ماچ کرد و داوای لێبوردنم لێی کرد و داوام لێکرد ڕێگای ڕاستم نیشان بدات ، ئەویش بە دەستی ئاماژەی بۆ لای هیندستان کرد و فەرمووی : لەم شارەدا فەتحت بۆ ناکرێ ، لەوێ فەتح و نیشانت بۆ دێت**



گۆڕی حەزرەتی شێخ عبداللە دەهلەوی

دلهی - هیندستان

**پاشان دەگەڕێتەوە کوردستان و وەک جاران دەست بە دەرس دانەوە دەکات ، ڕۆژێک موریدێک بەناوی میرزا رحیم اللە هاتە لای مەولانا و داوای لێکرد بچێت بۆ هیندوستان بۆ خزمەت شێخ عبداللە ی دەهلەوی ، پاشان مەولانا دەزانێت کە ئەمە ئەو نیشانەیەیە کە چاوەڕوانی دەکرد و دەچێت بۆ هیندوستان و کە شێخ عبداللە دەیبینێت شیاوە دەیکات بە خەلیفەی خۆی و فەرمانی گەڕانەوەی بۆ کوردستان دەدا**



مزگەوتی تەکیەی خالیدیە

بەغداد

**پاشان دەگەڕێتەوە سلێمانی و خەڵک دێنە پێشوازی ، پاشان دەچێتە بەغداد و شەش مانگ لە مزگەوتی حەزرەتی شێخ عبدالقادری گەیلانی دەمێنیتەوە ، ساڵی ١٨١١ زاینی دەگەڕێتەوە سلێمانی و پاشان لەسەر فەرموودەی شێخ عبداللە دەگەڕێتەوە بۆ بەغداد و لەو مزگەوتە نیشتەجێ دەبێ کە ئێستا بە تەکیەی خالیدیە ناودەبرێ**

پاشان میر مەحمود پاشای بابان چووە بەغداد و داوای لە مەولانا کرد بگەڕێتەوە کوردستان ، هاتەوە سلێمانی و میر مزگەوت و تەکیەی بۆ دروست کرد کە ئێستا بە خانەقای مەولانا خالید ناودەبرێت



مزگەوتی خانەقای مەولانا خالیدی نەقشبەنی سلێمانی

مەولانا خالید بە دامەزرێنەری تەریقەتی نەقشبەندی دادەنرێت لە شاری سلێمانیدا ، هەرچەندە بەهۆی هەڵە لێکتێگەیشتن هەندێک کێشەی بچوک لەنێوان مەولانا خالیدی شارەزوری نەقشبەندی و شێخ مارفی نۆدێی قادری ڕووی داوە ، بەڵام دواتر بوون بە دۆستی یەکتر و تەبایی و ئاشتەوایی لەنێوانیان بەردەوام بووە و شێخ مارف بە داوای لێبوردنەوە نامەی بۆ مەولانا خالید نوسیوە

پاشان لە سلێمانیەوە باری کرد بۆ بەغداد و لە تەکیەی خالیدیە خەریکی دەرس و فتوا بوو ، ساڵی ١٨٢٢ زاینی چووە دیمەشق ، لەوێ دەستی بە دەرسدانەوە و ئامۆژگاری کرد ، پاشان زیارەتی قودسی کرد و پاشان دووبارە حەجی کرد و پاشان گەڕایەوە بۆ شام

هەندێ لە مورید و خەلیفە و فەقێکانی مەولانا:

1. شێخ عوسمان سیراج الدینی تەوێڵە

2. مەلا عبدالله ی جەلی کۆیی

3. شێخ طاهیری بامەڕنێ

4. سەید طاهای نەهری

5. سەید عبیدالله ی نەهری

6. شێخ عەباسی کەرکوکی

7. شێخ ئیسماعیلی شێروانی

8. شێخ موحەمەد سلێمانی

9. شێخ فەتاحی ئاکرێ

**دڵۆپێک لە دەریای دانراوەکانی مەولانا:**

1. حاشیە لەسەر خەیالی و سەیلەکوتی شەرحی عەقائید

2. العقد الجوهري , في الفرق بين كسبي الماتريدي و الأشعري

3. شەرحی (أطباق الذهب)ی زەمەخشەری بە فارسی

4. نامیلکەی (اداب المرید)

5. نامیلکەی رابیطە

6. نامیلکەی زیکری نەقشبەندی

7. مەکتوباتی عەرەبی و فارسی

8. فرائد الفوائد في العقائد

9. **حاشيه لەسەر (جمع الفوائد)**

10. **حاشيه لەسەر شەرحی عەقائيدی (عضد)**

11. **حاشيه لەسەر (نهاية المحتاج) له فيقهی شافعی**

**منداڵەکانی مەولانا:**

1. **بهاء الدين**
2. **عبدالرحمن**
3. **شهاب الدين**
4. **نجم الدين**
5. **فاطم**

**نمونەيەک له شعرەکانی مەولانا به کوردی:**

**يا فـــــەردی ئەعزەم يا فەردی ئەعزەم**

**يا حەی ، يا قەييوم ، يا فەردی ئەعزەم**

**يا شـــــــــنەوەندەی ناڵەی سوبحەدەم**

**پەنـــــــای بەنديان ، بەندينخانەی غەم**

**يا فـەرازندەی چـــــــــــەرخ موعەللەق**

مەولانا لە شەوی هەینی ١٣ای مانگی ذي القعدة ساڵی ١٢٤٢ ی کۆچی - ١٨٢٧ای زاینی کۆچی دوایی فەرموو بەهۆی توشبوون بە نەخۆشـــی طاعون و لە گۆڕســـتانی کێوی قاســـیۆن لە دیمەشـــق بەخاک ســـپێردرا کە لەوێ ناســـراوە بە (زیارەتگای سەید خالیدی کوردی) ، ساڵی ١٨٤٢ ی زاینی لەسەر فەرمانی خەلیفە ســـوڵتـان عبـدالحمیـدی دووهەم گومبەت بۆ مەرقەدەکەی دروست کرا

ئارامگای حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی

دیمەشق - سوریا

ئارامگای حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی

گومبەتە سەوزەکەش دەردەکەوێت کە لەسەر فەرمانی

سوڵتان عبدالحمیدی دووهەم دروستکراوە

دیمەشق - سوریا

گۆڕی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی

شێخی تەریقەتی عەلیەی نەقشبەندی

دیمەشق - سوریا

## "حەزرەتی شێخ نورەدینی بریفکانی" [2]

**ناوی سەید شێخ نورەددینە کوڕی شێخ عبدالجبار کوڕی سەید نوری کوڕی ئەبوبەکر کوڕی زین العابدین کوڕی سەید شەمسەدین کوڕی شێخ عبدالرحمن کوڕی شێخ شمس الدین کوڕی شێخ عبدالکریم کوڕی شێخ موسا کوڕی سولەیمان کوڕی عبدالغني کوڕی ئیسحاق کوڕی سەید بابا مەنصور کوڕی سەید حوسێن (ئەخلاطی) کوڕی عەلی کوڕی سـەید حاجی نظام الدین کوڕی ئەحمەد ئەخلاطی کوڕی زین العابدینی هەمەدانی (زوردانی) کوڕی صـاڵەح هەمەدانی کوڕی یوسـف کوڕی سـەید سـەلیم عێراقی کوڕی محمد یوسف صدرالدین کوڕی حسین جلال الدین کوڕی زین العابدین کوڕی عەلی کوڕی سەید جەعفەر کوڕی سەید محمود کوڕی سەید احمد کوڕی سەید عبدالله ی منتخب کوڕی سەید عەلی موختار کوڕی سەید جەعفەر کوڕی سـەید کوڕی ئیمام عەلی هادی کوڕی ئیمام محمدی جەواد کوڕی ئیمام عەلی ڕەزا کوڕی ئیمام موسای کاظم کوڕی ئیمام جەعفەری صادق کوڕی ئیمام محمدی باقر کوڕی ئیمام عەلی زین العابدین کوڕی ئیمام حوسەین کوڕی سەیدە فاطیمەی زەهرا کچی حەزرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)**

**لە سـاڵی ١٢٠٥ کۆچی - ١٧٩٠ زاینی لە گوندی (ئیتووت) هاتە دونیا ، لە خزمەتی باوکی دەسـتی کرد بە خوێندن ، پاشان تەشریفی چووە ئامێدی ، ماوەیەکیش چووە شۆش دوایی چووە موصل پاشان چووە کۆیە و دوایی چووە شـەقڵاوە ، دوایی هاتە هەولێر و گەڕایەوە ئامێدی لای مەلا یەحیای مزوری مایەوە هەتا**

---

2 سەرچاوەکان :

١. مەلا طاهر مەلا عبدالله بەحرکەیی ، مێژووی زانایانی کورد ، بەرگی سێهەم ، لاپەڕە (٣٨٢ – ٣٨٦)

٢. بابە شێخ مەردۆخ ڕۆحانی ، مێژووی ناودارانی کورد ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە (٤١٩)

٣. مەلا عبدالکریم مودەریس ، علماؤنا في خدمة العلم و الدين ، لاپەڕە (٦٠٤ – ٦٠٦)

٤. مەلا عبدالکریم مودەریس ، بنەماڵەی زانیاران ، لاپەڕە (٣٣٠ – ٣٣٧)

ئیجازەی وەرگرت ، هەروەها ئیجازەی دووەمی لە مەلا ئیسلامی شۆشی وەرگرت ، ئیجازەی سێیەمی لە مەلا یونسی کوردی لە موصل وەرگرت

دوای کۆتایی هێنان بە خوێندن دەگەڕێتەوە خزمەت باوکی لە ئیتووت ، لەوێ دەست دەکات بە خواپەرستی ، سەر لە بەیانی قورئانی پیرۆزی دەخوێند ، پاشان تا نیوەڕۆ دەرسی فەقێیانی دەدا ، دوایی تا عەسر ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد ، دوای عەسر خەریکی وێردی تەریقەت بوو ، پاشان لەسەر فەرموودەی باوکی چووە موصل ، تەریقەتی قادری لە شێخ مەحمودی جەلیلی وەرگرت ، زۆری پێ نەچوو لەلایەن شێخەوە کرا بە خەلیفەی تەریقەتی قادری ڕیفاعی ، مامۆستا عبدالکریمی مودەریس دەفەرموێ کە ئەوکاتەی شێخ نوردەدین لە موصل بووە تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ نور محمدی هیندی وەرگرتووە

حەزرەتی شیخ نورەدین کەسێکی لەخواترس بوو و بەردەوام بە ڕۆژوو دەبوو ، دونیای وەلا نابوو ، هەرشتێک بۆی هاتبایەتە تەکیە بەسەر دەروێشەکانی دابەشی دەکرد ، کاربەدەستان بەدوایان دەنارد مووچەی بۆ ببڕنەوە نەدەچوو ، شارەزایی لە زمانی کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسی هەبوو

دڵۆپێک لە دەریای بەرهەمەکانی:

1. البدور الجلية
2. بهجة السالكين
3. آداب الخلوة
4. تنبيه النيام

5. إبراز دقائق الحقائق

6. الفتح الارحم

7. مناجات نوري

8. القصيدة التائية

9. تلخيص الحكم

10. القصيدة النونية

11. البدر

12. المكاتبات

**له كتێبی {رسالة آداب الخلوة} بەم شێوەیە باسی چۆنیەتی خەڵوەت کردن دەکات :**

**ماوەی خەڵوەت : ٤٠ ڕۆژە و ئەوەشـــــی زیاتری بکات بۆی خێرترە ، ئەگەر نەیتوانی ئەوا : ١٩ ڕۆژ ، ئەگەر نەیتوانی ئەوا ئەوەندە بکا کە خودای گەورە توانای دەداتێ کە کەمتر لەوە ١٢ ڕۆژە و کەمتر لەوە ٧ ڕۆژە و کەمتر لەوە سێ ڕۆژە**

**خوێندنی ویردی خەڵوەت : ١٩٠٠٠ جار لە ڕۆژدا و ١٩٠٠٠ جار لە شەودا**

**دوای هەموو ١٠٠٠ جارێک خوێندنی بســـــم الله الرحمن الرحيم یەکجار دووعا دەخوێندرێت ، نابێت لەمە کەمتر بێت لە خەڵوەتەکەت**

**چۆنیەتی خەڵوەت کردن:**

**خەڵوەت عادەتەن دوای بانگی مەغریب دەست پێدەکات**

**لێرەشـدا ئەوەندەی دەیزانم پێویسـتە لەسـەر هەموو داواکارێکی زانسـت کە شـێخێکی مورشـید چاودێری بکات لە خەڵوەتەکەیدا و نابێت ئەو کەسە خۆی بچێتە خەڵوەت**

**بزانە برای نەداری قادریم کە تۆ ئەگەر ویستت بەو ڕەفتارە بجوڵێیتەوە کە سوڵتانی ئەولیا و قوطبی ئەکبەر حەزرەتی شـێخ عبدالقادری گەیلانی ڕەزای خودای لەسـەر بێت پەیڕەوی دەکرد ئەوا پێویسـتە سـەرەتا بگەیتە کەماڵی ویلایەت و گەیشـتن بە پلەی ئیرشـاد بۆ ئەوەی سـودت پێ بگەیەنێت ، ئەگەر بەم عەقیدەیە نەهاتیت ئەوا سودی بۆت نابێت ، بچۆ بۆلای و لێ قبوڵ بکە هەر ئادابێکی ئاشکرا و نهێنی کە دەتداتێ ، ئەگەر تۆی بە شیاو زانی داخڵت دەکات**

**لە ماڵی خەڵوەتدا : پێویستە فەرمانی بۆتۆ بەم ئاداب و مەرجانە بێت ، خۆت بشۆ وەک شۆردنی مردوو ، ئەگەر چویتە خەڵوەت بزانە ئەوە گۆڕەکەتە بۆیە تەوبەی خودا بکە لە هەموو هەڵەیەک و هەوڵدان بەوەی هەرگیز بۆیان نەگەڕێیتەوە ئەو هەڵانە**

**شـێخی موشـریف و چاودێر هەوای پاک بۆ سـینەت دەهێنێت و چونە ناو خەڵوەت بەپێی ڕێنمایی ئەو دەبێت**

**ئەو ئادابانەی پێویستە بکرێن:**

- **خۆشۆردن پێش خەڵوەت**
- **ئەنجامدانی دوو ڕوکعەت دوای نوێژی مەغریب بە نیەتی چونە ناو خەڵوەت**
- **خوێندنی سورەتی فاتیحە و کافرون لە ڕوکعەتی یەکەم و خوێندنی سورەتی فاتیحە و ئیخلاص لە دووهەم ڕوکعەتدا**
- **دەست دەکەیت بە خەڵوەتەکەت بە بەرەکەتی خودای گەورە**

**ئەگەر چویتە ناو خەڵوەت و دەستت پێکرد ئەوا دەست بکە بە زیکری (بسم الله الرحمن الرحيم) مەهێڵە هیچ هەناسەیەکت بێتە دەرەوە بەبێ وتنی ئەوە و کاتت با بەفیڕۆ نەچێت و بزانە کە عەدەدێک هەیە دەبێت بە تەواوەتی و بەبێ کەم وکوڕی ئەنجامی بدەیت ئەگەر زیاتریش بوو خێری زیاترە بۆت و هەموو کەمیەک لەدەستت دەچێت ، ژمارەی پێویستیش پێشتر باسمان کرد**

**هەندێک ئادابی تر کە پێویستە ڕەچاو بکرێت:**

- **نیەتێکی پاک بۆ خودا بەتەنها**
- **توشنەبوون بە لوتبەرزی و خۆپەرستی بەوەی بەسەرت ڕوودەدات لەناو خەڵوەتدا**
- **قسەنەکردن لەگەڵ شێخەکەت مەگەر بۆ بابەتێکی گرنگ یان شەرعی بێت**
- **سود وەرگرتن لە هەموو هەناسەیەک کە دەری دەدەیتە دەرەوە بە زیکر کردن**
- **بەڕۆژوو بوون**

- کەمخۆری ، بۆ ئەوەی تەمەڵی و خەو بەسەرت زاڵ نەبێت

- شێوازی دانیشتن لەسەر ئەژنۆ دەبێ ئەگینا چوارمشقی (متربع)

- ڕوو بکە قیبلە و ئەگەر هەستت بە ماندویەتی کرد دەستنوێژ نوێ بکەرەوە و لە خەڵوەتەکەتدا پیاسەیەک بکە تا ڕوحی خزمەت تێتدا زیندوو و چالاک ببێتەوە

- پارێزگاری کردن لە نوێژە فەرز و سونەتەکان بە تەواوەتی و کەمتەرخەمی نەکردن تێیاندا

هەندێک لە خەلیفەکانی حەزرەتی شیخ نورەدینی بریفکانی:

1. شیخ طاهای سلێڤانی
2. شێخ عوسمانی ڕیچوانی
3. شێخ عەلی گەلی زەمانە
4. شێخ عبدالحمیدی بریفکانی
5. شێخ عبدالکریمی ئاکرێ
6. شێخ مصطفای ئامێدی
7. مەلا حامیدی دۆسکی
8. شێخ عبدالرحمانی جزیری
9. شێخ ئەحمەدی سەبعاوی

10. **شێخ طاهای بریفکانی**

11. **حاجی سەلیم ئاغەوات**

12. **شێخ عبدالفتاح زاخولی**

**منداڵەکانی شێخ نورەدین :**

1. **پیرۆز خان**
2. **فاطمە خان**
3. **صافیە خان**

**هەندێک لە تەکیەکانی حەزرەتی شیخ نورەدینی بریفکانی:**

1. **تەکیەی مامان**
2. **تەکیەی دهۆک**
3. **تەکیەی ئەتروش**
4. **تەکیەی موسڵ**
5. **تەکیەی کەڵەکچی**
6. **تەکیەی شێخان**

7. تەکیەی شێخ عبدالله ی فەخری موصڵی

8. تەکیەی شێخ مەحفوز بەگی عەباسی

9. تەکیەی عەلامە محمد نوری قادری

10. تەکیەی شێخ ئەحمەدی سەبعاوی

11. تەکیەی حەسەنی حەبار

12. تەکیەی سوڵتان خەلیفە

13. تەکیەی عەلامە عوسمانی ڕیزوانی

سەبارەت بە تەریقەتی شێخ نورەدین لە شیعرێکی بەیانی دەکات و دەفەرموێت:

حەقیقەت قادریمە ، من لە تەنگاوا رەفاعیمە

لە زەوقا سوهرەوەردیمە و غولامی نەقشبەندیمە

کەراماتی زۆر و بێ شـوماری هەیە ، دەفەرموێت : من لە سـێ شـتدا لەسـەر شـێوەی باپیری خۆمم کە حەزرەتە صلی الله علیه وسلم:

یەکەم : ئەو گەلەی من وام لە ناویاندا لە کەللە ڕەقیدا وەک کافرەکانی قورەیش وەهانە

**دووهەم : نەوەی نێرینەم نیە وەکوو ئەو**

**سێهەم : تەمەنم ئەوەندەی تەمەنی ئەو دەبێت کە ٦٣ ساڵ بووە ، حەقیقەتەن وەهاش دەرچوو لە ٦٣ساڵیدا وەفاتی فەرموو**

**شـــێخ نورەدینی بریفکانی ماوەی زیاتر لە چل ســـاڵ لە بریفکان خەریکی ئامۆژگاری دەروێش و موریدان و دەرسدانەوەی فەقێیان بوو ، تا ساڵی ١٢٦٧ کۆچی - ١٨٥٠ زاینی کۆچی دوایی کرد و لە بریفکان کە گوندێکی کوردی سەر بە شاری موصڵە بەخاک سپێردرا**




ئارامگای حەزرەتی شێخ نورەدین بریفکانی

گوندی بریفکان



مزگەوت و مەرقەدی شێخ نورەدینی بریفکانی

گوندی بریفکان

# "حەزرەتی شێخ مارفی نۆدێ" [3]

زانای ڕەببانی ، سەید شێخ محمد مەعرووف کوڕی شێخ مستەفای کوڕی سەید ئەحمەدی کوڕی سەید موحەمەدی نۆدێی ناسراو بە کبریت الاحمر کوڕی باوە عەلی وەندەرێنە کوڕی سەید بابە ڕەسولی گەورە کوڕی شێخ سەییدی کوڕی سەید ڕەسول کوڕی سەید قەلەندەری کوڕی شێخ عەبدوالسەیدی کوڕی سەید عیسای ئەحدەب کوڕی سەید حوسەین کوڕی سەید بایەزید کوڕی سەید عەبدوالکەریمی کوڕی سەید عیسای بەرزەنجی کوڕی سەید بابە عەلی هەمەدانی کوڕی سەید یوسفی کوڕی سەید مەنصوری کوڕی سەید عبدالعزیزی کوڕی سەید عبدالله ی کوڕی سەید ئیسماعیلی موحەدیث کوڕی ئیمام موسای کاظم کوڕی ئیمام جەعفەری صادق کوڕی ئیمام موحەمەدی باقر کوڕی ئیمام عەلی زین العابدین کوڕی ئیمام حوسەین کوڕی ئیمامی عەلی و حەزرەتی فاتیمە ی کچی حەزرەتی پێغەمبەر صلى الله علیه و على اله وصحبه وسلم

لە ساڵی (١١٦٦ کۆچی - ١٧٥٢ زاینی) لە گوندی نۆدێ سەر بە ناوچەی شارەزور لەدایکبووە ، لەخزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن ، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد ، کتێبە سەرەتاییەکانی نەحو و صەرفی تەواو کرد ، باوکی ناردیە (قەڵاچۆلان) پایتەختی بابانیەکان ، لە قوتابخانەی (غەزائییە) دەستی کرد بە (شەرحی موغنی) ، لەوێ مایەوە هەتا ساڵی (١٧٦٤ ز) ، پاشان چووە (هەزارمەرد) لای مەلا موحەمەدی ئیبنولحاج

---

3 سەرچاوەکان :

١. مەلا طاهر مەلا عبدالله بەحرکەیی ، مێژووی زانایانی کورد ، بەرگی سێهەم ، لاپەڕە (٢٥٦-٢٦١)

٢. بابە شێخ مەردۆخ ڕۆحانی ، مێژووی ناوارانی کورد ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە (٣٤٦ - ٣٤٩)

٣. مەلا عبدالکریمی مودەریس ، بنەماڵەی زانیاران ، لاپەڕە (٢٦١ - ٢٦٤)

٤. محمد امین زەکی ، تأریخ السلیمانیة ، لاپەڕە (١٧١ - ١٧٥)

کتێبەکانی سیوطی و حیسامکاتی و عبدالله یەزدی و مختصر و شەرحی عەقائیدی خوێند ، پاشان شێخ مارف گەڕایەوە قەڵاچۆلان و ماوەیەک لەلای مەلا موحەممەدی غەزائی شەریعەتی خوێند

کرا بە مودەریس لە مزگەوتی قەڵاچۆلان ، هەتا ئیبراهیم پاشای بابان شاری سلێمانی دروست کرد و پایتەختی بابان لە قەڵاچۆلان گواسترایەوە بۆ ئەوێ ، کە ئیبراهیم پاشا مزگەوتی گەورەی دروست کرد ، شێخ مارف بوو بە مامۆستای ئەو مزگەوتە ، شێخ مارف تەریقەتی قادری وەرگرتووە لە شێخ عەلی یە کۆسەی دۆڵپەموو ، کە مامی باوکیەتی و هەروەها باپیریەتی لە دایکیەوە ، ئەویش تەریقەتی لە شێخ ئیسماعیلی ولیانی وەرگرتووە

لە بەلاغە و بەگشتی لە زوبان و وێژەیی عەرەبیدا ئوستادی ڕۆژگاری خۆی بووە ، لە تەفسیر و حەدیس و ئەخبار و تەجوید و قیرائەتیشدا شارەزاییەکی تەواوی هەبووە ، بە هەرسێ زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی بەرهەمی هەبووە ، لە پارێزکاری و عیبادەت و بەجێ هێنانی سونەتی حەزرەت (صلی الله علیه وسلم) تا قۆناغی ویلایەت گەیشتووە

هەرچەندە بەهۆی هەڵە لێکتێگەیشتن هەندێک کێشەی بچوک لەنێوان مەولانا خالیدی بەغدادی نەقشبەندی و شێخ مارفی نۆدێی قادری ڕووی داوە ، بەڵام دواتر بوون بە دۆستی یەکتر و تەبایی و ئاشتەوایی لەنێوانیان بەردەوامی داوە و شێخ مارفی نۆدێ بە داوای لێبوردنەوە نامەی بۆ مەولانا خالید نوسیوە

حەزرەتی شێخ مارفی نۆدێ لە ساڵی (١٢٥٤کۆچی - ١٨٣٨ زاینی) کۆچی دوایی کرد و لەسەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی گردی سەیوان نزیک گۆمبەتی سولەیمان پاشای بابان بەخاک سپێردرا



ئارامگای حەزرەتی شێخ مارفی نۆدێ

گۆڕستانی سەیوان - سلێمانی

ئەم زاتە بەڕێزە لە زانا بەرزەکانی کوردســتان بووە و زانای دیار و گەورەی بنەماڵەی بەرزنجە بووە و خاوەنی دەستی باڵا بووە لە شیعر و ئەدەبدا و سوارچاکی مەیدانی زانستی عەرووز و هۆنینەوەی شیعر بووە

کوڕەکانی:

1. سەید موحەمەد
2. حەزرەتی حاجی کاک ئەحمەدی شێخ

دڵۆپێک لە دەریای بەرهەمەکانی:

1. لوغەتنامەی ئەحمەدی
2. أزهار الخمائل في الصلوات المشتملة على الشمائل
3. تخميس قصيدة البردة
4. تخميس قصيدة أءنعم عيشا

5. **الإغراب في نظم الإعراب**

6. **أوثق العرى في الصلاة على خير الورى**

7. **إيضاح المحجة و اقامة الحجة على الطاعن في نسب السادة البرزنجية**

8. **البرهان الجلي في مناقب شيخي السيد علي**

9. **ترصيف المباني في نظم تصريف الزنجاني**

10. **تنقيح العبارات في توضيح الإستعارات**

11. **تخميس قصيدة بانت سعاد**

12. **تخميس قصيدة المضرية**

13. **تخميس قصيدة الهمزية**

14. **تحميس لامية العجم**

15. **الفرائد في علم العقائد**

16. **البرهان الجلي في مناقب الامام علي (كرم الله وجهه)**

17. **تنوير العقول في أحاديث الرسول**

18. **الشامل في العوامل**

19. **القطوف الداني في حروف المعاني**

20. **كفاية الطالب في نظم كافية ابن الحاجب**

**نمونەیەک لە کتێبی {لوغەتنامەی ئەحمەدی} :**

**(رأس) سەرە ، (عین) چاوە**

**(بدن) قاڵب ، (إسم) ناوە**

**(أنف) لووتە ، (حاجب) برۆ**

**(فخذ) ڕانە ، (رکبە) ئەژنۆ**



ئارامگای حەزرەتی شێخ مارفی نۆدێ

گۆڕستانی سەیوان - سلێمانی

## "حەزرەتی شێخ ئیسماعیل ولیانی" [4]

سەید ئیسماعیلی ولیانی یەکێکە لە زاتە گەورەکانی بنەماڵەی بەرزنجییەکان ، کوڕی شیخ محمدی نۆدێیە کە ناسراوە بە (کبریتی سور) کوڕی سەید عەلی وەندەرێنە ، کوڕی شێخ بابا ڕەسولی گەورە ، نەسەبیشی دەگەڕێتەوە بۆ قوطبی عاریفان حەزرەتی ســەید عیســای بەرزنجە ، شــێخی ولیانی لە گوندی (نۆدێ) لە ســاڵی ١٠٨١ی کۆچی لەدایکبووە ، لەخزمەت باوکیدا گەورە بووە کە شــێخ محمد ئەمین نۆدێی بووە باوکی ، زانستە ئاینیەکانی خوێندووە و فێری قورئانی پیرۆز و نەحو و صەرف و فیقهـ و زانستەکانی تر لە خزمەت باوکی و کەسانی تر فێربووە.

شــێخی ولیانی خاوەن یادگەیەکی زۆر بەهێز بووە و پێش هاوتەمەنەکانی خۆی کەوتووە لە تێگەیشــتن لە زانستەکاندا ، لە ماوەیەکی کەمدا پلەیەکی بەرزی زانستی پێدرا کە کەسانی تر چەندین ساڵیان دەویست تا بەدەســتی بهێنن ، دوای ئەوەی قوڵبووەوە لە هەموو زانســتەکان ، ئیجازەی زانســتی لەخزمەتی باوکیدا وەرگرت و بوو بە زانا ، بەڵام تەنها بە فێربوونی زانستە ڕووکەشیەکان نەوەستا و هەوڵی فێربوونی زانستە هزری و فەلسەفیەکانیشی دا

---

4 سەرچاوەکان :

١. مەلا عبدالکریمی مودەریس ، بنەماڵەی زانیاران ، لاپەڕە (٢٣٥ – ٢٣٩)

٢. گۆڤاری مانگانەی دەنگی گێتی تازە ، ژ (١) ، (١٩٤٥) ز

٣. بابە شێخ مەردۆخ ڕۆحانی ، مێژووی ناودارانی کورد ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە (٢١٦)

٤. مەلا طاهر مەلا عبدالله بەحرکەیی ، مێژووی زانایانی کورد ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە (٢١٧ - ٣١٨)

٥. مەلا عبدالکریم مودەریس ، علماؤنا في خدمة العلم و الدين ، لاپەڕە (٩٥ – ٩٦)

بەمەش بە ئاراستەی زانستی تەصەوف رێی گرتە بەر بەبێ گوێدان بە مەترسی و قورسی رێگاکەی ، بەمەش توانی نەفسی خۆی خاوێن بکاتەوە و دوای ماوەیەک ئیجازەی هەردوو تەریقەتی (نوربەخشی) و (عەلەوی) لە باوکی وەرگرت ، کە تەریقەتی نوربەخشی تاکە تەریقەت بوو لای شێخەکانی بەرزنجە هەتا سەردەمی شێخ بابا رەسولی گەورە ، کە شێخ بابا رەسول کە لە سالی ٩٨٣ ی کۆچی لەدایکبووە دوای ئەوەی سلوکی تەواو کرد بەپێی تەریقەتی نوربەخشی ، تەریقەتی عەلەوی وەرگرت کە یەکێکە لە لقەکانی تەریقەتی خەڵوەتی لەسەر دەستی هەردوو شێخ نور الله و شکر الله ، ئیرشادی موریدەکانی کرد و لە سەردەمی شێخ بابا رەسولەوە هەتا سەردەمی شێخ محمدی نۆدێ هەردوو تەریقەتی نوربەخشی و عەلەوی بەربڵاو بوون لە کوردستان و عێراقدا هەروەها لە دیاربەکر و حەلەب

شێخی ولیانی هەردوو تەریقەتی نوربەخشی و عەلەوی وەرگرت لە باوکی و دەستی کرد بە گەڕان ، هەتا لە ناوچەی قەرەداغ جێگیر بوو و خەڵوەتی کرد لە ناوچەی (کەسنەزان) و ناوچەی (ولیان) کە تا ئێستاش شوێنی خەڵوەتەکان ماون و خەڵک زیارەتیان دەکات ، ئەو ماوەیەشی لەم دوو خەڵوەتە بەسەری بردووە لەنێوان حەوت بۆ هەشت ساڵ بووە بەپێی هەندێ سەرچاوە و خەڵکی متمانە پێکراو ، لەم ماوەیەشدا زۆر حەزی لە خەڵوەتەکە بوو و دەیویست ژیان دوور لە خەڵک بەسەر ببات و خۆی تەرخان بکات بۆ پەرستنی خودا ، بە بچوک سەیرکردنی ئەم دونیا فانیە و دەرپەڕاندنی ڕوحی پاکی لە کەلەپچەکانی لەش ، بەمەش شێخی ولیانی توانی هەموو پلەکانی زوهاد و صۆفیەکان ببڕێت ، ڕۆژ بەڕۆژ پلەی مەعنەویەکەی بەرزتر دەبوو

دوای ئەوەی ئەمری پێ کرا ئیرشـــاد بکا ، دەســـتی پێکرد و ڕووی کردە بەغداد ، لەوێ ســـەردانی شـــێخ ئەحمەدی ئەحســـائی کرد و بەیعەتی پێدا و تەریقەتی قادری لەخزمەتی وەرگرت ، دوای ئەوەی چەند چلەیەک لە خەڵوەت مایەوە ، گەڕایەوە بۆ کوردســـتان و تەریقەتی قادری لەگەڵ خۆی هێنا کە لەو کاتەدا لە کوردستان ناسراو نەبوو ، شێخ مستەفای خۆشناوی ناسراو بە شامی بوو بە هاوەڵی و بەڕێکەوتن بۆ گوندی (قازانقایە) لە ناوچەی قەرەداغ ، لەوێ دوای تێپەڕاندنی قۆناغە ڕوحیەکان ئیجازەی وەرگرت و بوو بە یەکێک لە خەلیفەکانی شـــێخی ولیانی و ڕۆیشـــت بەرەو ناوچەی (خۆشـــناو) و (کوی) خەڵکیش لێی کۆبونەوە و بوون بە مورید و تەریقەتیان وەرگرت پاشان چوو بۆ شام و لەوێ تەریقەتەکەی بڵاو کردەوە

لەم کاتانەشـــدا شـــیخی ولیانی لە (قازانقایە) مایەوە و خەڵکێکی زۆر ڕوویان تێکرد و بەشـــێکی زۆر لە زانایانی کوردســـتان شـــوێنی کەوتن ، کەراماتەکانی لەناو خەڵکدا بەربڵاو بوو ، لەوانەش بۆنمونە : شـــێخ محێدینی کەرکوکی دەفەرموێت : چەندین کەرامەتم لێی دیوە بۆنمونە بەســـەر ئاو ڕۆیشـــتن و بینینی حەزرەتی خدری زیندە و سەرخستن و دورخستنەوەی بەرپرسەکان لە پلەکانیان بە دووعای ئەو ، هێنانی میوە کە هی ئەو وەرزە نەبێت

لە کوڕەکانی شێخی ولیانی:

1. شێخ ڕەزا ، کە یەکێکە لە ئەولیا گەورەکانی سەردەمی خۆی لە کوردستان و ناسراوە بە شێخ ڕەزای دێلێژە

2. شێخ عبدالکریمی خاوێ

3. شێخ مەحمودی کلێسە

4. شێخ ڕەسول

5. شێخ عبدالرحمن

6. شێخ مارفە کۆسەی کانی کەوە

7. شێخ یەحیا ناسراو بە (کاک یەحیای دێوانە)

پیری ولیانی هەزاران مورید و خۆشەویستی هەیە ، چەندین خەلیفەی هەیە لەوانەش :

1. شێخ ڕەزای دێلێژە

2. شێخ موئمینی سازانی

3. شێخ عبدالله عەبدالانی

4. شێخ عبدالغنی نابلسی

5. دەروێش مصطفی خۆشناوی

6. فەقێ مچەی جاف

7. شێخ عەلی سوسێ

8. شێخ عەلی دۆڵپەموو کە مامۆستای شێخ مارفی نۆدێ بوو و شێخ مارفی نۆدێ لە ڕێی شێخ عەلی دۆڵپەموو تەریقەتی قادری وەرگرتبوو

دوای ماوەیەک سەفەری کرد بۆ ناوچەی بادینان بۆ ئیرشاد و زیارەتی موریدەکانی ، لەوێ نەخۆش کەوت و وەفاتی کرد ، پاشان لە گوندی ڕۆڤیا بەخاک سپێردرا لە ساڵی ١١٥٨ ی کۆچی , شێخ ئیسماعیلی ولیانی بوو بە باپیری هەریەکە لە ساداتی : قازان قایە ، کەسنەزانی ، خاوێ ، دێلێژە ، کانی کەوە ، گۆپتەپە ، قەرەچێواری ، هەشەزینی ، کانی خاکی



ئارامگای حەزرەتی شێخ ئیسماعیل ولیانی

ناحیەی ڕۆڤیا – قەزای بەردەڕەش - دهۆک

## "حەزرەتی شێخ محیّدینی کەرکوک" [5]

**ناوی شێخ محمد کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەردە کوڕی سەید موحەممەدی نۆدێی بەرزنجی حوسەینی ، کە نازناوی (محي الدين)ی هەبووە و بە شێخ محیّدینی کەرکوک ناسراوە**

**لە دێی قووڵە لە بازیان لەدایکبووە سـاڵی ١١٣٣ ی کۆچی و سـێ کوڕی هەبووە بەناوی شـێخ عبدالعزیز و شێخ محمد و شێخ حەسەن کە لە شیخ عبدالعزیز شێخ مەحمودی قوطب(شۆریجە) بەجێ ماوە و بنەماڵەی شـێخ حەسـەنیش لە دێی قوولەی بازیاندا ماوەتەوە ، شـێخ محیّدین لەسـەر مەزهەبی شـافعی بووە ، تەریقەتی قادری هەبووە کە لە مامی خۆی (شـێخ ئیسـماعیلی ولیانی) وەریگرتووە ، لەوانەشـی کە لە بەردەسـتی شـیخ محیّدیندا پێگەیشـتوون (شـێخ عبدالصـمدی گڵەزەردە)ی برای و (شـێخ مارفە کۆسـتە)ی ئامۆزای بوون**

---

5 سەرچاوەکان :

١. مەلا عبد الكريم المدرس ، علماء في خدمة العلم والدين ، لاپەڕە (٥٠٤ – ٥٠٥ – ٥٥٨)

٢. حسين القاضي ، سراج السالكين ، لاپەڕە (١٢)

٣. شێخ محمد الخال ، معروف النودهي البرزنجي ، لاپەڕە (٧٦ – ٧٧)

٤. معروف الرشلاني ، مناقب السادات البرزنجية ، مخطوطة ژمارە (١٢٨٣)

٥. بابە شێخ مەردۆخی ڕۆحانی ، مێژووی ناودارانی کورد ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە (٢٦٠)

٦. محمد أمين زكي ، تأريخ السليمانية ، لاپەڕە (٢٢٦)

٧. مەلا طاهر مەلا عبدالله بەحرکەیی ، مێژووی زانایانی کورد ، بەرگی سێهەم ، لاپەڕە (١٠٣ - ١٠٤)

٨. عمر رضا كحالة ، مجمع المؤلفين ، جوزئی 12 ، لاپەڕە (٢٠٧)

٩. مەلا عبدالکریمی مودەریس ، بنەماڵەی زانیاران ، لاپەڕە (٢٥١ – ٢٥٢)

١٠. شێخ سیروان سەرگەڵویی ، ساداتی بەرزنجە ، لاپەڕە (٩١ – ٩٥)

**سەرەتا لە دێی قووڵە بووە پاشان ساڵی ١١٧٩ ی کۆچی تەشریفی چووە بۆ کەرکوک ، زانایەکی خواناس و زاهید بوو و یەکێکە لە شێخە گەورەکانی ناو کورد ، زانستەکانی لەخزمەت ناودارترین زاناکانی کوردستان خوێندووە وەک :**

1. **شێخ مصطەفای غەزائی**
2. **شێخ جەعفەری مەجزوم**
3. **شێخ موئمینی سازانی**
4. **شێخ جەلالی خورماڵی**
5. **مەلا عبداللە ی هەراتی**

**خاوەنی زیاتر لە ١٤ بەرهەمە لە بوارەکانی ئاین و تەصەوف و پزیشکی ، هاوسەردەمی موفتی زەهاوی بووە ، شارەزاییەکی تەواوی لە زمانی ( عەرەبی و تورکی و فارسی و هندی و سریانی) هەبووە**



ئارامگای حەزرەتی شێخ محێدینی کەرکوکی

**لەگەڵ باوکی سەفەری کردووە بۆ خاکی حیجاز و لەوێ فێری فیقهـ بووە و پاشان دوای کۆچی دوایی شێخ حەسەنی باوکی لە گڵەزەرد گەڕاوەتەوە لە دێی قووڵە بووە بە مامۆستا و ئیمام و وانەی وتووەتەوە و یەک دوو ساڵ لەو دێیەدا ماوەتەوە و دوایی چووە بۆ ناحیەی قەرەحەسەن و لە دێی تەیمەز ئاوا دانیشتووە و سێ ساڵ تێیدا ماوەتەوە و پاش ئەوە تەشریفی چووەتە کەرکوک و بەردەوام**

**بووە لە ئیرشاد هەتا وەفاتی فەرمووە ساڵی ١١٩٥ ی کۆچی و لە نزیک تەکیەکەی خۆی لە گۆڕستانێکی شاری کەرکوک بەخاک سپێردرا کە ئێستا بە گۆڕستانی شێخ محێدین ناسراوە**

**شـێخ عبدالرزاقی دێلێژە دەفەرموێت : لە کۆسـاری گڵەزەردەدا کەم تەختە بەرد هەیە کە شـێخ محێدین نوێژی لەسەر نەکردبێ و سوجدەی بۆ خودا لەسەر نەبردبێ**

**نمونەیەک لە کەراماتەکانی : لە زمانی شـێخ یاسـینی بەرزنجەییەوە دەگێڕنەوە دەفەرموێت : لەگەڵ شـێخ محێدیندا کەوتینە ڕێ بۆ بەرزنجە ، کاتێ لە دێی گڵەزەرد دەرچووین باوکم کە شـێخ ڕەسـولی بەرزنجیە و خاڵی شـێخ محێدینە ، فەرمووی : ئێوە ئەمڕۆ مەدەن لە ئاوی تانجەرۆ ، ئاوەکە زۆرە ، من سـوارم دەرئەچم ئێوە ڕاوەستن تا ئاوەکەی ئەنیشێتەوە ، باوکم بە سواریی ڕۆیشت ، ئەو ڕۆیشت و ئێمە ماینەوە ، زۆری پێ نەچوو شـێخ محێدین هات دەسـتی گرتم و فەرمووی : بێن بە شـوێنما ، ڕۆیشـتە ناو چەم و ئێمەش بە دوایدا لە چەم پەڕینەوە ، کە تەماشـام کرد دەبینم لەشـمان تەڕ نەبوو بوو ! کاتێ گەییشـتین بە باوکم ، فەرمووی : ئەمە کاری محێدینە ، ئەگەرنا ئێوە ئەو پیاوە نەبوون وا لەو ئاوە دەربچن**

**هەندێک لە بەرهەمەکانی شێخ محێدنی کەرکوک:**

1. **بحر الانساب**
2. **جامع الفوائد**
3. **برأ الالام**

4. **مجمع الجواهر**

5. **ابدال الاعمال**

6. **معاون الآل في فضائل الآل**

7. **جليب الراحة والأفاقة في رفع الفاقة**

8. **رسالة في الأوفاق و الطب و دفع الشيطان**

9. **أصلاح النفوس و اداب السلوك**

10. **كشاف الكروب باعثة لتلين القلوب**

11. **السيف القاطع**

12. **كشف الأعمال**

13. **ضائع الأعمال**

14. **تسهيل الصعاب**

15. **النباء العظيم**

16. **شرح الهمزية**

17. **القصيدة المعشرة**

18. **صنائع الأعمال**

19. **الصلوات**

**تێبینی : ئەمانە هەموو دەستنوسن و چاپ نەکراون**

## "حەزرەتی شێخ عەبدولعەزیزی گەیلانی" [6]

شێخ عبدالعزیز کوڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی کوڕی سەید موسا کوڕی سەید عبداللەی جیلی کوڕی سەید یەحیای زاهید کوڕی سەید محەمەد کوڕی سەید داودی ئەمیر کوڕی سەید موسای دووەم کوڕی شێخ صالح کوڕی سەید موسای الجون کوڕی سەید عبداللەی المحض کوڕی ئیمام حەسەنی موثەنا کوڕی ئیمام حەسەنی کوڕی ئیمام عەلی کوڕی ابوطالیبە کرم الله وجهە

لە ٣ی شەوالی ساڵی ٥٣٢ی کۆچی لە شاری بەغداد لەدایکبووە و لەسەر دەستی باوکی جەنابی شێخ عبدالقادری گەیلانی قدس الله سرە پێگەیشتووە و قوتابی باوکی و شێخ ابومنصور عبدالرحمان کوڕی محەمەد القزاز و جگە لەوانیش بووە ، دوای ئەوە وتاری بۆ خەڵک داوە و ئامۆژگاری خەڵکی کردووە و وانەی گووتووەتەوە و لەسەر دەستی ئەو ژمارەیەکی زۆر لە زانایان و دانایان پێگەیشتوون

شێخ عبدالعزیز گەیلانی پیاوێکی لێهاتوو و ئازا و بەتوانا و سادە و دەرکەوتوو بووە هاوشێوەی باوکی حەزرەتی شێخ عبدالقادری گەیلانی قدس الله سرهما کە یەکێک بووە لە پیاوانی بانگخواز و چاکەکار و تێکۆشەر لە پێناو ئایینەکەی و بەرگری لێکردنی.

---

6 سەرچاوەکان :

١. التاذفي ، قلائد الجواهر ، لاپەڕە (٢٤٦ – ٢٤٨)

٢. د.جمال الدين فالح الكيلاني ، الشيخ عبد القادر الكيلاني رؤية تاريخية معاصرة ، لاپەڕە (٢٨)

٣. مەلا عبدالکریمی مودەریس ، بنەماڵەی زانیاران ، لاپەڕە (٣١)

به فەرمانی باوکی حەزرەتی شـــێخ عبدالقادری گەیلانی جەنابی شـــێخ عبدالعزیز گەیلانی چۆتە ناوچە شـــاخاوییەکانی دەوروبەری شـــنگاڵ لە باکوری ڕۆژئاوای موســـل بۆ بانگەواز و پەروەردەکردنی خەلک و بڵاوکردنەوەی بنەماکانی ئایینی پیرۆزی ئیســـڵام و ڕێبازی قادری تا ئێســـتاش شـــوێنەکەی ماوە و دیارە و خەلک سەردانی دەکات

دوای ئەوە ڕوو لە شاری ئاکرێ دەکات و لە شوێنێکی ئەم شارە نیشتەجێ دەبێت کە ئێستا بەناوبانگە بە گەلی شـــێخ عبدالعزیز ، لەو شـــوێنەدا دەســـتی کرد بە بڵاوکردنەوەی بنەما و ڕێســـاکانی ڕێبازی قادری و ئامۆژگاری خەلک و ڕووکردنیان بەرەو پەرســـــتنی خوای گەورە و فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە کاری ناڕەواو وپابەندبوون بە ســـوونەتی پێغمبەری پێشـــەوا صـــلی الله علیه وآله وســـلم ، خەلکێکی زۆر ڕوویان لێکرد و لەسەر دەستی بەیعەتیان وەرگرت و بوونە دەروێش و موریدی ئەو

لەوکاتەدا لە شـــاری ئاکرێ قەڵایەک هەبووە کە ئێســـتا بەناوبانگە بە ســـەرێ کەلێ پاشـــایەک فەرمانڕەوایی دەکرد کە تا ئێستاش شوێنەواری ئەو قەلایە ماوە ، دەنگ و باس گەیشتە ئەو پاشایە کەوا کەسێک هاتۆتە شـــارەکەی و ناوی شـــێخ عبدالعزیز گەیلانییە و لە ئەشـــکەوتێک پەرســـتنی خوا ئەکات و لەو ئەشـــکەوتە ئەمێنێتەوە و ڕێسا و یاساکانی ئایینی پیرۆزی ئیسڵام و ڕێبازی قادری بڵاوئەکاتەوە ، وە خەڵکێکی زۆر لە دەوروبەری کۆبۆتەوە و ڕێنماییان ئەکات و شارەزاییان ئەکات لە شەریعەتی ئیسڵامی، بۆیە پاشاکە سێ جار بە دوای ئەنێرێ و داوای لێدەکات بێتە دیداری ، بەڵام شێخ عبدالعزیز ناچێتە لای و ئەلێ من پیاوێکی هەژارم خوا دەپەرستم ، هیچ پێویستییەکم نیە لای پاشا ، ئەگەر پاشا حەز بە بینینی من ئەکات با ئەو بێتە لام ، کاتێ ئەو پەیامەیان گەیاندەوە لای پاشا ، پاشا سەڕی سووڕما لە قسەکانی و هات بۆ دیداری

شێخ عبدالعزیز گەیلانی ، کاتێک چاوی کەوت بە جەنابی شێخ عبدالعزیز و ئەو سادەیەی جەنابی شێخ ، دڵی بۆی چوو و بەیعەتی وەرگرت لەسەر دەستی و بووە یەکێک لە دەرویش و شوێنکەوتووانی و بە جەنابی شـــێخی گووت داوا بکە هەر چی ئەتەوێ ، بەڵام شـــێخ عبدالعزیز گەیلانی پێی گووت کەوا هیچی لەو ناوێت تەنیا ئەوە نەبێ لە دوای کۆچکردنی قوببەیەک لەســـەر گۆڕەکەی دروســـت بکات بۆ ئەوەی شوێنەوارەکەی ون نەبێت و شوێنەکە وەک بنکەیەکی بڵاوکردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسڵام هەر بمێنێ

دوای کۆچی دوایی شێخ عبدالعزیز پاشا بەڵێنەکەی بەجێهێنا و قوببەیەکی بچووکی دروست کرد لەسەر گۆڕەکەی ، پاشـاکەش وەسـیەتی کرد کەوا لە نزیک گۆڕی جەنابی شـێخ بنێژرێ ، بۆیە ئەڵێن گۆڕی ئەم پاشایە ئێستا لەو گۆڕستانەی تەنیشت مەرقەدی شێخ عبدالعزیز گەیلانییە

لە کوڕە ناســراوەکانی شــێخ محمد هەتتاکە کە لە ناحیەی ڕۆڤیا نێژراوە و گۆڕەکەی ئەکەوێتە تەنیشـــت گۆڕی شێخ اسماعیل ولیانی لە ژێر یەک قوببە ئەم شێخ محمد هەتتاکەش لە دوای خۆی کوڕێکی جێگەی گرتۆتەوە بەناوی شێخ محمد حسام الدین ناسراو بە شەرشیق، هەروەها شێخ عبدالعزیز کچێکی زاناشی هەبووە بەناوی زەهرە کە زانســـتی خوێندووە و وانەی گووتووەتەوە لە بەغداد و هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە

شـایەنی باســە شـێخ عبدالعزیز گەیلانی باپیری ســەیدەکانی حەیالی یە کە لە عێراق بڵاوبوونەتەوە لە پارێزگاکانی بەغداد و موســل و ئەنبار و دیالە و ســەلاحەدین وکەمێکیان لە پارێزگاکانی باشـــوور هەن

هەروەها لە دەرەوەی عێراقیش لە وڵاتانی سوریا و تورکیا ومیسڕ و لیبیا و مەغریب و هیند و پاکستان و وڵاتانی تریش بوونیان هەیە

شێخ عبدالعزیز گەیلانی لەشاری ئاکرێ بەردەوام بوو لەسەر پەرستنی خوا و ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ بڵاوکردنەوەی زانست و ڕێنیشاندانی خەلک تاکو کۆتایی تەمەنی کە لە ڕۆژی چوارشەمە ڕێکەوتی ١٨ی ربیع الاولی ساڵی ٦٠٢ی کۆچی کۆچی دوایی کرد و هەر لە شاری ئاکرێ لە نێوان چیاکان لەو شوێنەی کە ئێستا ناسراوە بە گەلی شێخ عبدالعزیز نێژراوە ، لە تەنیشت مەرقەدەکەی ئەشکەوتێکی بچووک هەیە کە نزیکەی چوار مەتر چوارگۆشەیە کە شوێنی خەلوە و عیبادەتی بووە، لە سەرووتریش کانییەک هەبوو کە تا ئێستاش ماوە هەر لە تەنیشت مەرقەد تەکیە و مزگەوت و شۆرباخانەیەک هەیە بۆ نان دانی خەلک کە هەزاران کەس لە دەروێش و مورید وزانایان وەفدە ڕەسمییەکان و زانستخوازان و خەلکی تریش سەردانی دەکەن بەم پێیەش ئەو شوێنە بۆتە بنکەیەک بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێبازی قادری لە عێراق و جیهانی ئیسلامی،هەروەها مەرقەدی شێخ عبدالعزیز گەیلانی بە کۆنترین و گەورەترین شوێنی پیرۆز دادەنرێ لە کوردستانی عێراق

تەکیەی قادری و مەرقەدی شێخ عبدالعزیز گەیلانی لە شاری ئاکرێ بە چەند قۆناغێک گەورە کراوە و فراوان کراوە تاکو گەیشتۆتە ئەوەی ئێستا هەیە ، بەڵام کۆششی گەورە ئەگەڕێتەوە بۆ جەنابی شێخ سعید شێخ عبدالعزیز بەرزنجی ولیانی کە لە ٢٠٠٠/١١/١ کۆچی دوایی کردووە و لە ناحیەی ڕۆڤیا نێژراوە لە پاڵ باپیرە گەورەی شێخ اسماعیل ولیانی ، کە هەستا بە نوێ کردنەوە و بیناکردنی قوبەکە و هەر لە شوێنی خۆی قوبەیەکی گەورەتری دروست کرد و مزگەوت و تەکیەی دروست کرد کە لە چەند ژوورێک پێکهاتووە

بۆ پێشـــوازی میوان ومانەوەیان هەروەها چەند ژوورێک بۆ دەروێش و موریدەکان و شـــۆرباخانەیەک بۆ ناندانی ڕۆژانەی هەژار و داماوان ، هەروەها هەســتا بە ڕاکێشــانی ڕێگا بۆ تەکیە و ڕاکێشــانی هێلی کارەبا ، هەروەها کتێبخانەیەکی دروســت کرد کە ســەدان کتێب لەخۆدەگرێ ،هەروەها لە ســاڵی ٢٠٠٧ حکومەتی هەرێمی کوردســـتان هەســـتا بە دروســـت کردنی خانووەکانی ســـەرووی تەکیە و فراوان کردنی تەکیە و مزگەوت و نوێ کردنەوەی حەڕەمی مەرقەد و قوبەکە و فراوانکردنی بۆ چەند نهۆمێک بەڵام تا ئێستا بەهۆی دۆخی ئابووری و دارایی هێشتا ئەم فراوانکردنە تەواو نەکراوە بۆیە شێخ وریا شێخ سەعید بەرزنجی ولیانی شێخی تەریقەتی قادری ولیانی ئەرکی تەواوکردنی مەرقەدەکەی گرتە ئەستۆ

ســـاڵانە هەزاران خەلیفە و دەروێش و مورید و شـــوێنکەوتووانی ڕێبازی قادری لەم شـــوێنە کۆدەبنەوە بۆ زیندووکردنەوەی بۆنە و مەڕاســیمە ئایینیەکان لەوانە یادی لەدایکبوونی خۆشــەویســت صلی الله علیه و سلم و یادی لەدایکبوونی شــێخ عبدالقادری گەیلانی قدس الله ســره و زیندووکردنەوەی شــەوی ئیســرا و میعراج و شەوی نیوەی شەعبان و شەوی قەدر و جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان و هەموو ڕۆژانی هەینی، شایەنی باسە ئێستا جەنابی سەید شێخ وریا شێخ سەعید بەرزنجی ولیانی شێخی ئێستای ڕێبازی قادری ولیانی سەرپەرشتی تەکیە و مەرقەدی شێخ عبدالعزیز گەیلانی دەکات.



ئارامگای شێخ عبدالعزیزی گەیلانی پێش نۆژەن کردنەوە - ئاکرێ

## ئارامگای حەزرەتی شێخ عەبدولعەزیزی گەیلانی دوای نۆژەن کردنەوە







## "حەزرەتی شێخ عەلی هەکاری" [7]

شـێخ عەلی هەکاری قورەیشــی کوڕی ئەحمەد کوڕی یوســف کوڕی جەعفەر کوڕی عەرەفە کوڕی مەئمون کوڕی موئەمیل کوڕی وەلید کوڕی قاسم کوڕی وەلید کوڕی عوتبە کوڕی ئەبوسوفیانە

ئیمام و پێشــەوا و زاهید و زانا و دانا و فەقیە و پیاوچاک بووە ، چاکە و عیبادەت و پەرســتنی یەکجار زۆر بووە ، لە مانگی شەوالی ساڵی ٤٠٩ ی کۆچی بەرامبەر ١٠١٨ای زایینی لە گووندی دیرەش لەدایکبووە (دیرەش گوندێکە ئێســتا ســەربەقەزای ئامێدی یە و لە باشــووری ڕۆژهەڵاتی قەزای ئامێدی یە وە دەکەوێتە باکوری چیای گارە ، ئەوکاتە سەر بە میرنشینی هەکاری بووە )

هەروەک خۆی ئەفەرموێ تەمەنم دە ســاڵ بووە دەســـتم کردووە بە وەرگرتن و گێڕانەوەی فەرمووده ، جا بۆ وەرگرتنی فەرمووده زۆر وڵات گەڕاوە و گەیشـــتووە بە خزمەت زۆر لە زانایان و دانایانی ئەو ســـەردەمە و فەرموودەی لێ وەرگرتوون

ماممۆستاکانی ( ئەوانەی فەرموودەی لێیان وەرگرتووە )

لە موصڵ:

* ئەبوجەعفەر موحەممەدی کوڕی موحتاجی مەروزی فەقیە

---

7 سەرچاوەکان :

١. صالح شیخو الهسنیاني - علماء الكورد وكوردستان – لاپەڕە (٣٠٦)

٢. ابن كثير - البداية والنهاية – لاپەڕە (٤٨٦)

٣. ابن الاثير - الكامل في التاريخ – لاپەڕە (١٥٢٠)

٤. الذهبي – سير أعلام النبلاء – بەرگی ١٩ – لاپەڕە (٦٧)

**لە حەلەب:**

**❊ئەبولقاسم عەلی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موزەفەری موقرئ**

**لە صەیدا:**

**❊ئەبوموحەمەد حەسەنی کوڕی موحەمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی جومیع**

**لە صور:**

**❊ئەبوفەرج عەبدولوەهابی کوڕی حوسێنی کوڕی عومەری کوڕی بورهان**

**لە بیت المقدس لە قودس:**

**❊ ئەبوبەکر موحەمەدی کوڕی ئەحمەدی واسیتی خەتیب**

**لە ڕەملە:**

**❊ ئەبوحوسێن موحەمەدی کوڕی حوسێنی کوڕی تەرجومان**

**لە میسرِ:**

**❊ئەبو عبدالله موحەمەدی کوڕی فازیلی کوڕی نەزیفی فەڕاء**

**❊ ئەبوقاسم هەبەتولای کوڕی عەلی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی شامەی موعافیری**

**لە مەککە:**

⁕ئەبوحەسەن موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی صەخری ئەزدی

⁕ئەبومەنسوور موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی قاسمی موقرئ

له بەغداد:

⁕ئەبوقاسم عبدالملک کوڕی موحەممەدی کوڕی عبداللەی کوڕی بوشران

⁕ئەبوقاسم حوسەینی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی شیرازی

⁕ئەبوحەسەن عەلی کوڕی عومەری کوڕی قەزوینی

⁕ئەبوبەکر موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی موسای خەیاط

ئەم زانایانەش حەدیسیان له شێخ عەلی هەکاری وەرگرتووه:

- ئەبولقاسم کوڕی سەمەرەقەندی
- ئەبوعەلی کوڕی بەناء
- ئەبویاسین عبداللەی کوڕی موحەممەدی بەردانی
- یەحیای کوڕی عەتاف
- عبدالرحمان کوڕی حەسەنی فارسی
- حەسەنی کوڕی ئەبوعەلی موقرئ

شێخ و مامۆستای له تەسەوف و سلوک دا:

**لەبەغداد تەریقەتی وەرگرتووە لەسەر دەستی شێخ ئەبوالفەرجی تەرتوسی**

**کە ئەویش لەسەر دەستی شێخ عبدالواحدی تەمیمی وەریگرتووە**

**ئەویش لە شێخ ئەبوبەکری شیبلی**

**ئەویش لە شێخ جونەیدی بەغدادی**

**ئەویش لە شێخ سڕی سەقەتی**

**ئەویش لە شێخ مەعروفی کەرخی**

**ئەویش لە شێخ داودی تائی**

**ئەویش لە شێخ حەبیبی عەجەمی**

**ئەویش لە شێخ حەسەنی بەصری**

**ئەویش لە ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیب کرم الله وجهە**

**ئەویش لە حەزرەتی پێغەمبەری وەرگرتووە صلی الله علیە وسلم**

**ئینجا شـــێخ عەلی هەکاری گەڕایەوە گووندەکەی خۆی و خۆی جیاکردەوە بۆ عیبادەت و یەکتاپەرســتی ، ئینجا خەلک ڕوویان تێکرد و لە زانست و تەسەوفەکەی سوودیان وەردەگرت و باوەڕێکی چاکیان پێ هەبوو ، چەندین تەکیەی کردۆتەوە بۆ دەروێش و موریدەکانی لە شــوێنی جیاواز ، وە خەلیفەکانی بڵاوبوونەوە بە**

**ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی دا ، بەتایبەت لە کوردســـتان و هیندســـتان و ئەفغانســـتان و ..... ، لە خەلیفە**

**ناودارەکانی لە کوردستان:**

**⁕ شێخ موحەمەد مەغریبی بەرواری خاوەنی کتێبی ( الرباعيات الرقيقة الطرية في التصوف ) و (المنظومة باللغة الفارسية )**

**⁕ شێخ پیرموس ، کە لە گووندی زێوە ی سەر بە ناحیەی بامەڕنێ نێژراوە**

**⁕ شێخ موحەمەد موتەوەکیل ، لە گووندی مائی نێژراوە**

**⁕شێخ موسا ، لە گووندی نیشا سەر بە هەکاری نێژراوە**

**⁕ شێخ عەلی ، لە گووندی دزە سەر بە هەکاری نێژراوە**

**⁕ شێخ بەتاری و چەندانی تر**

**وە لە خەلیفە ناودارەکانی لە شـــاری بەغداد شـــێخ ئەبوســـەعید موبارەکی مەخزومی یە کە خاوەنی قوتابخانەیەکی گەورەی ئاینی بووە و سەدان قوتابی هەبووە (قوتابخانەکەی لە ئێستادا مزگەوت و تەکیە و مەرقەدی شێخ عبدالقادری گەیلانی یە) ، هەروەها شێخ موبارەکی مەخزومی مامۆستا و شێخ و ئوستازی حەزرەتی سوڵتانی ئەولیا سەید شێخ عبدالقادری گەیلانی یە کە لە دوای خۆی شێخ عبدالقادری گەیلانی لەسەر قوتابخانەکەی دانیشتووە و وانەی گووتووەتەوە و ئیرشادی خەلکی کردووە.**

**شـــێخ عەلی هەکاری زۆر عیبادەتی کردووە و زوهدی زۆر بووە و دڵپاک بووە و لای هەموو کەس قەبوڵ و ڕێزلێگیراو بووە**

**⁕شـــێخ یەحیای کوڕی مەندە ئەفەرموێ شـــێخ عەلی هەکاری هاتە لامان ، زۆر نوێژ و عیبادەتی دەکرد و یەکێک بوو لە گەورەی سۆفییەکان**

**⁕عەبدولغەفاری کوڕی موحەمەدی کوڕی مەنسـووری کوڕی عەلانی کەرجی ئەفەرموێ حەدیسـم وەرگرتووە لە شێخ عەلی هەکاری و چاوەکانم قەت کەسێکی وایان نەبینیوە لە چاکی و لە زوهد دا**

**زۆر لە پیاوچاکانی گەورە پێیان گووتووە تۆ شـێخی ئیسـلامی ، بەڵام شـێخ عەلی لە بەکەمزانینی خۆی فەرموویەتی بەلکو من شێخێکم لە ئیسلام ، لە سەرەتای مانگی موحەڕەمی ساڵی ٤٨٦ی کۆچی بەرامبەر ١٠٩٣ی زایینی لەتەمنی ٧٧ســـاڵی کۆچی دوایی کردووە و لە گووندی دیرەش نێژراوە و مەرقەدەکەی ناسراوە و خەلکێکی زۆر سەردانی دەکەن ، شایەنی باسە چەند ساڵێک پێش ئێستا بەهۆی بۆردومانەکانی تورکیا ، مەرقەدی پیرۆزی بەر بۆردومانەکە کەوتووە و زیانی پێگەیشـــتووە ، وەک لەم وێنەیەدا پاشـــماوەی مەرقەدەکە دەردەکەوێت**



## "حەزرەتی شێخ عوسمانی بیارە" [8]

شـێخ محمد عثمان سـراج الدینی بیارە (دووهەم) کوڕی شـێخ محمد علاء الدینی بیارە کوڕی شـێخ عومەر ضیاء الدینی بیارە کوڕی شێخ عثمان سراج الدینی تەوێڵە (یەکەم) کوڕی سەید خالد کوڕی سەید عبدالله کوڕی سەید محمد کوڕی سەید دەروێش کوڕی سەید مشرف کوڕی سەید جومعە کوڕی سەید ظاهر ، کە سـەید ظاهر لە سـاداتی نعێمی حوسـەینی هاشـمیە لە حەمرینی دیالە ، نەسـەبیان دەگەڕێتەوە سـەر حەزرەتی ئیمامی حوسەین (رضي الله عنه و علیه السلام)

شێخی بیارە لە سالّی (١٣١٤ی کۆچی - ١٨٩٦ی زاینی) لە خانەوادەیەکی زانستی و ئاینی و کۆمەڵایەتی لە گوندی (سـەفی ئاباد) سـەر بە ناحیەی ڕەوانسـەر -قەزای جوانڕۆ لەدایکبووە ، هەر لە سـەرەتای منداڵی خوێندنی لای شـێخ عەلائەدینی باوکی دەسـت پێکردووە ، قورئان و تەجویدی لای قورئان خوێنی باڵای میسـڕ (شـێخ مسـتەفا ئیسـماعیل) خوێندووە ، دواتر درێژەی بە خوێندن داوە و تا دواتریش لە سـەردەمی شێخایەتیدا زانایی و پزیشک زانی ئەو گەیشتە ئاستێکی زۆر باڵا

شـێخی بیارە دەسـتی کردووە بە قورئانی پیرۆز و خەتمی کردووە ، کتێبە سـەرەتاییەکانی تەواو کردووە و زانسـتی عەرەبی لەلای مەلا سـەید حوسـێنی سـابڵاغی و مەلا عبدالکریمی خانەشـووری لە قوتابخانەی

---

8 سەرچاوەکان :

١. عبدالله ملا ئەحمەد - نەقشبەند و نەقشبەندیەکان – لاپەڕە (٣٦٩ – ٣٧٣)

٢. شێخ امین شێخ علاء الدین نەقشبەندی - تەصەوف چی یە ؟ - لاپەڕە (٤١٣ – ٤١٤)

٣. مەلا طاهر مەلا عبدالله بەحرکەیی - مێژووی زانایانی کورد - بەرگی دووهەم – لاپەڕە (٣٥٤ – ٣٥٦)

٤. حاجی مەلا ئەحمەدی قاضی پێنجوێنی - باخچەی بۆنخۆشان – لاپەڕە (٦٤١)

**بیارە و دووڕوو خوێندووە ، بۆ زانیاری تەصـــەوف لە ژێر چاودێری باوکی بووە و هەر لە منداڵیەوە پەروەردەی ویرد و زیکر و تەریقەت بووە**

**شێخی بیارە لە خانەقادا مایەوە تا وەفاتی شێخ عەلائەدینی باوکی ، پاشان لە بەر شیاویەتی لە جێگەی باوکی بە شێخی تەریقەت دانرا ، لە ساڵی (١٩٥٨) دوای ئاڵۆزیەکانی عێراق ، ئەو وڵاتەی بەجێ هێشت و ڕۆشـــتەوە خانەقای (دوڕۆ) لە کوردســـتانی ئێران ، لەوێدا ژمارەیەکی بەرچاو لە زانایان و کەســـایەتیە جۆراوجۆرەکان هاتنە خزمەتی لەوانیش زانای گەورەی کوردســـتانی ڕۆژهەڵات (مامۆســـتا مەلا باقری بالک) کە لە زانستی شەرعیدا گەیشتبووە ئەوپەڕ ، هەروەها شێخ عبدالقادری داغستانی و چەندین زانای تر**

**دوای تێکچوونی بارودۆخی ئێران لە ساڵی (١٩٧٩) سەر لە نوێ شێخی بیارە ئێرانی جێهێشت و گەڕایەوە کوردستان ، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم لە هەڵگیرساندنی شەڕی خوێناوی نێوان ئێران و عێراق ، شێخی بیارە تەشریفی چووە بەغداد ، خانەقای بەغداد لە بیارە و دوڕۆ زیاتر ئاوەدانی بەخۆیەوە بینی**

**شـێخی بیارە چارەســەری دەردی نەزانی دەکرد و چارەســەری دەردە پیســەکانی دووزمانی و حەســوودی و چاوپیسی دەکرد بە یادی خودا و زیکر و خواپەرستی و دڵپاکی ، جگە لە دەردە بزرەکان پسپۆڕی دەردەکانی ئەندامیش بوو ، چەندین نەخۆشـــی کوشـــندە دەهاتنە لای ، بە داودەرمانی گییایەکانی چیای (هەورامان) چارەی بۆ دەدۆزینەوە ، هەروەها شێخی بیارە زمان ڕەوان و نوسەر و شاعیریش بووە**

**نمونەیەک لە شیعرەکانی:**

**یا رسول الله زەلیلم سا بە قوربان هیمەتێ**

**شەرمەزار و دڵ بریندارم بە قوربان هیمەتێ**

**تێنوی دڵ ئاوەرینی قەترەییێکی ڕەحمی تۆم**

**ڕێزە خوار و کەلبی دەرگاتم بە قوربان هیمەتێ**

**شاسواری عەرصەیی مەیدانی حەق ڕۆژی جەزا**

**تۆ مەبە غافڵ لە (عوسمان) ، سا بەقوربان هیمەتێ**

**براکانی حەزرەتی شێخ عثمانی بیارە:**

1. **شێخ مەولانا**
2. **شێخ محمد ضیائی**
3. **شێخ ناجی**
4. **شێخ موختار**
5. **شێخ ئەمین**
6. **شێخ ثابت**
7. **دکتۆر مەزهە**

**کوڕەکانی حەزرەتی شێخ عثمانی بیارە:**

1. **شێخ جمال الدین**
2. **شێخ عبدالملیک**
3. **شێخ محمد ڕەئوف**
4. **شێخ محمد ناصح**
5. **دکتۆر شێخ مادح**

**دوای دەیان ساڵ لە خزمەت و زەحمەت و ماندوێتی وئاوارەیی بە دەست چەرخە جۆراوجۆرەکانی زەمان ، ئەم چرا پڕتەو و خواناسە بە هیممەت و پزیشکە لە تەمەنی ١٠١ ساڵیدا و لە شەوی (٣٠،٣١ -١-١٩٩٧) لە ئەستەمبوڵی پایتەختی وڵاتی تورکیا ، ماڵئاوایی لە ژیان کرد و ملیۆنەها هەوادار و موریدی بەجیهێشت**

**زنجیرەی تەریقەتی نەقشبەندی:**

**لە خوداوە جل جلالە بۆ حەزرەتی جبریل بۆ حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ حەزرەتی ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) بۆ سەلمانی فارسی بۆ قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبوبەکری صدیق بۆ ئیمام جەعفەری صادق بۆ بایەزیدی بەسطامی بۆ ئەبولحەسەنی خەرقانی بۆ ئەبو عەلی فارمەدی بۆ شێخ یوسفی هەمەدانی بۆ شێخ عبدالخالقی غەجدەوانی بۆ شێخ عارفی ڕیوەگەری بۆ شێخ مەحمود ئەنجیری فەغنەوی بۆ شێخ عەلی**

ڕامەتینی بۆ شێخ محمد بابا سەماسی بۆ شێخ سەید کولال بۆ شاهی نەقشەبەند شێخ محمد بەهائەدین بۆ شـێخ عەلائەدینی عەطار بۆ شـێخ یەعقوبی چەرخی بۆ شـێخ عبید الله ی ئەحڕار بۆ شـێخ محمد قازی زاهید بۆ دەروێش محمد بۆ شـــێخ محمد خواجەکی ئەمەنکی بۆ شـــێخ محمد باقی بۆ ئیمامی ڕەبانی حەزرەتی شێخ ئەحمەد فاروقی سەرهەندی بۆ شێخ محمد معصوم بۆ سەید محمد سیف الدین بۆ سەید نور محمد ئەلبەدوانی بۆ شێخ شمس الدین حبیب الله جان جانان مظهر بۆ شاه عبدالله ی دەهلەوی بۆ شـــێخ مەولانا خالیدی بەغدادی نەقشـــبەندی بۆ شـــێخ عثمان ســـراج الدینی تەوێڵە بۆ شـــێخ محمد بهاء الدینی تەوێڵە بۆ شێخ عمر ضیاء الدینی بیارە بۆ شێخ محمد علاء الدینی بیارە بۆ سەر دەستی حەزرەتی شێخ عثمان سراج الدینی بیارە

هەندێک لە نوسینەکانی شێخی بیارە:

1. تەفسیری سورەتی (و التین)
2. پەرتووکەکانی (سراج القلوب)
3. الشهب الثاقب و الاعتقاد الرصین و الیقین بالله
4. رسالة الرابطة

**وێنەی حەزرەتی شێخ عوسمانی بیارە**





**وێنەی دەرەوەی مەرقەدەکە - ئیستەنبوڵ**



**وێنەی ڕوکەشی مەرقەدەکە**



**وێنەی ناو مەرقەدەکە**



سەرچاوە :


1. مەلا طاهير مەلا عبدالله بەحرکەيی ، مێژووی زانایانی کورد ، نوسينگەی تەفسير – هەولێر ، چاپی دووەم ، ٢٠١٦

2. محمد امين زکی ، تأريخ السليمانية ، ناوەندی نور حوران – ديمەشق ، ٢٠١٦

3. بابە شێخ مەردۆخ ڕۆحانی ، مێژووی ناودارانی کورد ، ئەکاديميای کوردی – هەولێر ، چاپی يەکەم ، ٢٠١١

4. محمد مطيع الحافظ و نزار أباظة ، علماء دمشق و أعيانها في قرن الثالث عشر الهجري ، ناوەندی الفكر المعاصر – بەيروت ، ١٩٩١

5. عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد ، نەقشبەند و نەقشبەنديەکان ، چاپی يەکەم ، ٢٠١٨

6. مەلا عبدالكريم مودەريس ، بنەماڵەی زانياران ، کتێبی کانی – سنە ، چاپی يەکەم ، ٢٠١٠

7. مەلا عبدالكريم مودەريس ، علماؤنا في خدمة العلم و الدين ، چاپی يەکەم ، ١٩٨٣

8. گۆڤاری دەنگی گێتی تازە ، ١٩٤٥

9. حسين القاضي البرزنجي ، سراج السالكين

10. شێخ محەمەدی خاڵ ، معروف النودهي البرزنجي ، ناوەندی چاپخانەی التمدن – بەغداد

11. عمر رضا كحالة ، مجمع المؤلفين ، مؤسسة الرسالة

12. شێخ سیروان سەرگەڵویی ، ساداتی بەرزنجە ، چاپخانەی کارۆ – کەرکوک ، چاپی یەکەم ، ٢٠١٤

13. التاذفي ، قلائد الجواهر ، مكتبة و مطبعة مصطفى الحلبي – میسر ، چاپی سێهەم ، ١٩٦٥

14. جمال الدين فالح الكيلاني ، الشيخ عبدالقادر الكيلاني رؤية تاريخية معاصرة ، دار الفكر – پیتسبۆرگ ، چاپی دووهەم ، ٢٠١٤

15. صالح شيخو الهسنياني ، علماء الكورد و كوردستان ، مطبعة هاوار – دهۆک ، ٢٠١٢

16. ابن كثير ، البداية و النهاية ، بيت الأفكار الدولية – لوبنان ، ٢٠٠٤

17. ابن الاثير ، الكامل في التأريخ ، بيت الأفكار الدولية – لوبنان ، ٢٠٠٤

18. الذهبي ، سير أعلام النبلاء ، بيت الأفكار الدولية – لوبنان ، ٢٠٠٤

19. حاجی مەلا ئەحمەدی قاضی پێنجوێنی ، باخچەی بۆنخۆشان ، چاپخانەی هێڤی – هەولێر ، چاپی یەکەم ، ٢٠١٦

20. شێخ امین شێخ علاء الدین نەقشبەندی ، تەصەوف چییە ؟ ، چاپخانەی چوارچرا – سلێمانی ، چاپی سێیەم ، ٢٠١٥

حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی

حەزرەتی شێخ نورەدینی بریفکانی

حەزرەتی شێخ مارفی نۆدێ

حەزرەتی شێخ ئیسماعیل ولیانی

حەزرەتی شێخ محێدینی کەرکوک

حەزرەتی شێخ عەبدولعەزیزی گەیلانی

حەزرەتی شێخ عەلی هەکاری

حەزرەتی شێخ عوسمانی بیارە